# دیوانی دڵدار

لە سەر ئەرکی چاپخانەی کوردستان چاپ کراوە



❁ چاپی یـەکەمین ❁

چاپخانەی کوردستان

هەولێر

٢٥٧٣ کوردی

# وێنەی دلدار



بەڵێ خۆشە ئەمەل گەر بێ لە سەر ئەم ڕێگەیە ڕەنجدەی
بەڵام هەر گەر خەیاڵات بێ ئەوەی هەتبێ ئەویش ئەڕوا

( سوپاس )

لەکانگای دڵەوە سوپاسی مامۆستا مجید رِؤفی برای دڵدار دەکەم بەبۆنەی ئەوەوە دیوانەکەی کاکی بەهەموو مافیەکیەوە پێشکەش بەچاپخانەی کوردستان کردووە

گیویی موریانی

# بەسەرهاتی دڵدار

دڵدار (١) ناوی (یونس) ە کوڕی مەلارۆوف کوڕی محمود کوڕی مەلاسەدی خادم‌السجادەیە لە (٢٠) شباطی ١٩١٨ ی زایینی لەشاری کۆیەدا پێی ناوەتە ناوەیدانی گیتییەوە . ناوی دایکیشی (زەهرە) کچی خورشیدی ولەمەلازادەکانی لای (زەهاو) ە لەوێرا هاتبوونە کەنارزێی کۆیە

دڵدار لەآخەلێوەی گرانیەکی وادا لەدایك بووە کەشەپۆلی گێژاوی نەگبەتی سەرتاپای ڕووی‌زەویی داگرتبوو خەڵکی بێ ئەندازە برسی‌و پەریشان‌و بەلەنگاز بوون . ئەوانیش لەبەر گرانی‌و بەهۆی ئەوەوە کەجەندرمەی عثمانیان دەخل‌و دانیان لی ئەستاندبوون زۆر بەپەریشانی ڕوویان لەهەولیری کردبوو

دوای ئەوەی کەولاتی موصل بەهەولیرو شوینەکانی ترەوە لەژیر دەستی عثمانی ڕزگاری هات هەرفەرمانبەرێکی سەری بۆفەمانی اینگلیزان شۆر کرد لەسەر کاروباری خوی مایەوە هەر کە سیێکیش سەری شۆر نەکردبی پەراگەند بووەمالی‌دلدار یش‌یەکێك بوولەو دەربەدەرانە

---

(١) بەشی زۆر تریني ئەو بەسەر هاتەم لەدەستنووسی دلدار وەرگرتووە کەلەسەر داخووازیی خۆم لە بەغداوە لە ٩٤٣/١/٦ دا بۆی نارد بووم وایستاش هەر لەلام ماوە

لەهەولێری مەلا ئەفەندیی کەخاڵۆزای باوکی بووە گوندیی (بێستانەیان) دەداتی کەبەکشتوکاڵی وێ خویانی پێ بژیەنن بەڵام ئەمەزۆر ناخاییێ نێوانیان تێك دەچی و (بیستانە) یان لێ دەستێنرێتەوە وروو لەشاری هەولێر دەکەنەوە ، هەروەکو خۆی دەیگرێتەوە لەوپەڕی هەژاریی و پەریشانیەتی دا ڕادەبووێرن گۆیا ئەگەر کلاو دروون نەبووایە بەجارێکی لەناودەچوون حەوتسالی قروقاتی بەکوێرەوەریی بەسەردەبەن .

لەسالی (١٩٢٦) دا جەوادیی برای لەکۆیە دەمرێ بەو بۆنەیەوە بەوماڵەوە ڕوو لەکۆیە دەکەنەوە دوای ماوەیەکی باوکی کرا بەفەرمانبەریی سەرئەژمیریی ڕانیە دلدار لەتەمەنی دەسالی دا دەخرێتەقوتابخانەوە و پولی یەکو دوولەوێ کۆتایی پێدەدا . دلدار ڕانیەی زوریی پێ خوشبووە دەڵی : (هەرچەند ڕۆژێکی چاك و چوار ڕۆژانیش نەخۆشبووم سەر ڕاپی ئەوەش ڕانیەم هەرلەلا خوشبوو بەتایبەتی سەوداسەریی قوولله (١) بووم ، هەرکاتی چاك بووبامایەوە مەلەم لەڕووبارەکەو لەبن دارەبییەکان ڕاوەچۆلەکەم دەکرد .

دلدار لەهاوینی ١٩٣٠ دا لەگەڵ سەعدی برای ڕوو

---

(١) قوولله لەڕانیە کانیەکی بەرینە ئاوەکەی ڕوونو بەفراوە

لەهەولێر دەکەن ، ووچانی هاوینی لە (مخمور) ی لەلای کاکە
آصفی بەسەر دەبات . آصفی برای کوردایەتی تێدەگەیەنی‌و وفێری
بەکار هێنانی چەکیشی دەکات
سەودای نیشتمان‌و تیرئەندازیی شۆرشێکی گرنگی خستە ناو
ئایدی آلی دلدارەوە . هەرلەو هاوینی‌دا باوکی‌لەرانیە لەسەر فەرمانی
دەولەتی‌لادەبەن مالی‌باوکی خانوەکەیان دەفرۆشن وبەرەو کۆیە
دەگەرێنەوە دلدار خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی لەکۆیە
کۆتایی پی‌دا
دلدار دەلی :(هێشتا لەقوتابخانەی سەرەتایی دابووم کەدیوانی
حاجی قادری کۆیم زۆرتری لەبەرکردبوو وهەمیشە بەوردی
سەرنجم لەهەلبەستەکانی عەونی‌و راجی‌و عاصی‌و حسینی‌و هیرانی دەدا
ولەبەریشم دەکردن بەوانەش‌دا بێ‌ین‌نەبووم هەلبەستی هەرکەسێکم
دەستکەوتبایە دەمنووسییەوە ولەبەریشم دەکردن بەتایبەتی هەلبەستی وەفایی
کوردی ، بێکەس ، زیوەر ، پیرەمیردم زۆرلەبەرکردن ووەدەلی‌هەر
لەوسالەدا هەستم بەوەدەکرد کەچیژە(لذة ) لەهەلبەست وەرگرم‌و
زۆر گیرۆدەی ببووم )
هەستی بوویژێتی دلدار لەهەولیری‌ی سەرهەلدالەسالی (١٩٣٥)دالەپۆلی
یەکەمی ئانەویی لەهەولیری‌دا هەستی بەوەکرد کەزانیاریی قوتابخانەکەمە
هەتابەشی ئەوەی ناکا کەتەنانەت پیلەبازیی( مجادلە )یەکی‌زانستی پی‌وەبکری

ناچار له نامه‌خانه‌كه‌ی كاكه سه‌ده‌ی‌دا ده‌ستی به خوێندنه‌وه‌ی په‌رتووك ( كتێب ) ان ده‌كات له پێش هه‌موو شتێكی دا مێژووی شۆرشی فه‌رانسه‌و مێژووی یۆنان‌و دوای وان مێژووی ( استقبال ) ی جلال نوری ناودار هه‌ر سێك به‌رگی به‌ووردی‌و لیٚ كۆلینه‌وه‌ ده‌خووێنێته‌وه انجا سه‌رنج ده‌داته مێژووی بابان‌و سۆران‌و موكریانی داماو ( حزنی ) موكریانی و مێژووی كوردو كوردستانی ئه‌مین زه‌كی به‌گیش . ئه‌وانه گشتیان دروشمی ڕاپه‌ردوویان ده‌هێناوه پێش چاوی گه‌یشته ڕاده‌یه‌كی واكه‌بتوانی شوینه باشه‌كانی مێژوو په‌سندو هه‌لبژیریشیان بكات

دلدار ده‌لیٚ :( له ١٩٣٥ داكه‌دیوانی نالیم‌زۆر به‌ووردیی خووینده‌وه هه‌لبه‌سته جووانه‌كانی نالی‌له‌گه‌ل‌هۆنراوه آگرینه‌كانی حاجی قادری‌له‌سه‌ر پێشه‌وایه‌تی ویژه‌یی له‌مێشكم‌دا شه‌ڕیان‌بو . ئه‌وكێشه‌كێشه‌ده‌رگای‌هونه‌ری بوویژێتی لیٚ كرده‌وه ، زۆر كه‌لكه‌له‌(خیالٚ )ی‌وام‌له‌كه‌للـه‌دابوو حه‌زم‌ده‌كرد له‌بۆته‌ی هه‌لبه‌ستانی‌دا برێژم ئه‌وجا به‌ناو خه‌لكیان‌دا بلاوبكه‌مه‌و ایترهه‌ر خوم‌تاق ده‌كرده‌وه)

دلداریه‌كه‌مین هه‌لبه‌ستیكی كه‌چاپكراوه بۆكۆڤاری‌ڕووناكی ایده‌ی دانابوو كه‌له‌ژماره (٢) ی‌سالی( ١٩٣٥ )دا بلاوكرایه‌وه

دڵدار لەساڵی ١٩٤٠ دا ثانەوی لە کەرکوك تەواو کرد ایترلەوێرا چووە بەغدا ولەوی چووە ناوزانستگای دادپەروەری یەوە وئەویشی لە(١٩٤٥)دا تەواو کرد

دڵدار ئەو سێ ساڵەی دووایی بەپارێز گاری (محاماة) وخوێندنەوەو و نەخۆشي بەسەر برد ، چونکوو کەم وابوو کە بۆي بکەوي ، زۆرترینی هەڵبەستە کانیشی هی سەردەمي قوتابیەتي بووە چەندهەڵبەستیکی کەدووای تەواو کردني زانستگا داینا ون پڕ وواتاو بەرزن وادیارە کەلەدووايي ژیانیدا لەهەموو روویێکەوە هەنگاوی زلزلی بەرەو پوختەو پاراوي دەهاویشت

لەمێژبوودوو آزاری کوژندە تەنگیان بەدلدار هەڵچنی بوو یەکیان باداریي دووەمیان آوسانی دڵ لە ١٢/١١/١٩٤٨دا کەتازە لەنەخۆشی ڕاست بەوۆوە بوهەندي کاروباری خۆی ڕووله‌هه‌ولێری دەکات ، ایوارە لەیانە بیباری سوورەوە کراو دەخووا لەپاشان لەگەل چەند برادەرێکی کەیەکیکیان (عمرەسوور) ی بەرەوان دەبی دەچنە سینەمای سەوور لە گەڕانەوەدا لەحاستی ئەوشوێنە کەنێزیکی میوانخانەی شادی(اوتیل فرح) یەبرادەرەکانی لادەدەن ئەویش ڕاستاو ڕاست بەشەقامی مظفردا بەرەو تەیراوا یەدەڕوا کەبچیتەوە مالی سعدی برای

کەلەڕاست اوتیلی کوکب الشمال تیدەپەڕیڕەتدەبا هەر چۆنیکی دەبێ خۆی دەگەیەنێتە چایخانەیەکی بن قەلاتی و لێی دەکەوێ وادیارە بەخواردنەکە چیپکێلدانەی ژەهراوی بووەبەلام خەلکەکە وایان دەزانی سەرخۆشە ایتر بەعەرەبانەدەی نیررینە بەخۆشیخانە بەلان لەبەرچارەڕەشیی و بەدبەختیێ دو کتۆری پاسەوان ئەوشەوە لەسەر مێزی دەولەمەندێکی شاری خەریکی خواردنەوەی بوو بەسەرلی ڕانەگەیشت

ایتر بەوجوورە ئەودلە پر تاسەو آرەزووە زۆرەی ژیانو خۆشەویستیە لەلێدان کەوتو وەستا

بەلام ناوی دلدار ، هەستي دلدار ، هەلبەستی دلدار ، گیانی پاکی دلدار نامرێ و بەلکوو لەناو دلی هەموو کوردیکي آبڕومەندداو لەناو میژووی ویژەی کوردستانی دابەیادگار هەتاهەتایە دەمێنێتەوە

# خووو ڕەشتی دلدار

دلدار گەنجێکی سوورو سپی مووزەردی بالآمەیلەو بەرزی بیسری گۆشت بور ، دووچاوی گەشی ڕاکێشەری نیگاتیژی هەبوو ، لەکاتی بیر کردنەوەو لێکدانەوەدا چاوەکانی وێل دەبوون ،وەرام لەمستو تابلۆی قسەخۆش وبەجێ وزۆر جار لەکاتی قسەکردن دامەسەلەی جوانو ڕازو (نیکتە) ی خۆش وقسەی نەستەق ئەهێنایەوە ، شارەزاییێکی باشی لەژیان و گوزەران وآکاری کوردەواری داهەبوو لەسەرەتای قسەکردنی دا زمانی دەگیرا بەلام کەدەکەوتە گەرمەی دوان کەمڕێ دەکەوت کەبگیرێ ، سەیر ئەوەبوو نەی دەتوانی لەسەر قاقەز ووتارێك بخوێنیتەوە کەچی کەکۆبوونەوەی زۆر گەورەلەبەردەم میزی پێوەرەدا ڕادەوەستاو بۆماوەیێکی دریژو لەبەر زۆر باش دەدووا کۆبونەوەی کەقسەی تێداکردبێ کۆبونەوەی ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٨ بوو داوای لێ کرا کەهەردەبێ بەنوسینوو تارێك پیشکەش بکاتەویش وتارەکەی نوسی بەلام لەکاتی خویندنەوەدا سەیری کاغەزی نەدەکردو هەرلەبەر دەی خوێندەوە زمان گیرانەکەشی وەنەبێ زگماکی بوو بێ بەلکو خۆی ئەگیرێتەوە کاتی لەبێستانەدەبن لەتەمەنی چوار سالان دا دەبێ توشی نەخۆشیەکی زۆر گران دەبێ

وساليكي رەبەق ئەخايێنێ وە لەو ماوەيەدا تووشي ئەم زمان گيرانە دەبێ

دلدار گەنجێكی چاو تێژرو گران وسەنگین وزۆر بەوزبو ،

هەرچەند لەدەوری هەژاریش‌دا بوەوە ژیاوە بەلام آبرووي خانەوادەيي

وخۆ بەكەم‌دانەنانی هەرپاراستوە لەمذكراتەكەيدا دەڵی :

( تصوركەن كەجارجاردەچوينە قصری مەلائەفەندی لەوێ شیرینی وشەكریان

بۆدەهێنام نەك وەری بگرم بەلكو تەماشاشم نەدەكرد ، لەبەرئەوەی نا

كەگۆیا نەمزانی بێ ئەوانە خۆش و من لێیان محروممم وەیا حەزم

لێیان نەبووبێ ، بەلكو وام‌چوبوە میشكەوە كەلەمالی خەلق تەماشای

شتی‌خەلق كردن خراپە . . . دەڵی ئیستاش هەرلەسەر ئەو

خووەماوم ، واتادەتوانم زۆر بەآسانی لەگەل چاخی ژیانی خۆم ،

خۆم رێك بخەم ، هیشتاكە بەفكرم دانایێ بەتایبەتی حەزم چوبێتە

چ جوورە خواردنیك ، وەیالەچ چەشنە خواردنیك بێزو بۆم كردبی )

. . . ئەمە هەندیك بوو لەرەوشت و خووی دڵدار .

# بوویژێتی دلدار

لە ڕووی ئەوەوە کەلەپێش چاپی ئەو دیوانەدا زۆر کەس لە دلدار دوواوە وەبوویژێتی وشاعریەتی دلداریان دەرخستوەو بە خوێندەوارانی کوردو عەرەبیان ناساندوە ، لەبەر ئەو هۆیانە شتێکی ئەو تۆ ناناوسم مەگەر ئەوە نەبێ کە دلدار بوویژێکی بەرزو بە هرەدار بوو نیشانەی بوویژیتی بە تەواوی هەر لە ڕۆژانی منداڵیەوە سەری هەڵدا بوو ، لەو ڕۆژانەدا کە دیمەنی جوانو دڵرفێنی قووله هەمو هەستو هۆشی لێ داگیر کرد بو . لەو کاتەدا کەخەیاڵو بیر کردنەوەو تەنیا دانیشتن بو بوون بە شێوەیەکي نەژادیو هەمیشەیی دلدار .

جا ئەمانەو جوانی کوردستانو ژیانی تاڵو ترشي خۆي بەتایبەتي وەهي هەمو کورد گەل بەگشتیو هەلبەستە نیشتمان پەروەریەکانی حاجي قادري کۆیي و شەمره ناسکەلە کانیڕاکێشەکانی ناڵي و بوویژاني تری کورد هەموي تیکەل بەیەکتر بوون هەوێنی دلي دلداریان گرتەوەو

بەخوێندەوارییکی بەرزو دەولەمەندیش ئاو درا ، ئەگەر مردن ئەماني ( مانی ) بدایە بێ گومان لوتکەیەك ئەبوو لە لوتکە بەرزەکانی هەلبەستي کوردي ، بەلام دەلێي چی

لەدەست چەرخی چەپ گەرد کە نەی هێشت دڵدار بگاتە
چڵە پۆپەی آوات

لێرەدا ژیانی کورتی دلدارزۆر دەشوبهێتە ژیانی شاعری گەنجي ئازادی خوای تونس ( ابو القاسم الشابي )، کە بلیمەتیک بوو لە بلیمەتاني هەلبەستو تەنیا ٢٥ ساڵ ژیا .

## پایەی زانستی و شوێنەوارەکانی دڵدار :

دلدار خوێندەوارێکي ووریا بوو هەر لەمنداڵیەوە وەکو باسمان کردبوو کومەڵە پەرتووکێکی باشي مێژوویی بە کوردي و عەرەبي خوێندبوو وە ولێی ورد بوبووەوە ئەمە بێجگە لە دیوانە شعرە کوردیەکان جا دوا بەدوای ئەمانە بێجگە لە کتێبەکانی ئانوی‌و حقوق هەر کتێبێکی کەوتبایە دەستی زۆر بە شەوقەوە ئەی خوێندەوەوە زۆر مەراقی فەلسەفەو زانینی آینەکان بوو

بەو دوایيە شارەزاییەکی باشي لە سەرەتای فەلسەفەدا هەبوو تەنانەت هەندێ نوسیني زۆر رێك‌و پوختي فەلسەفیشی هەیە لە ١٥ ی ئووزي سالی ١٩٤٠دا لەشەقلاوە چاوی بە ( بهیة فرج الله ) ئەکەوێ کە ئەم کچە وێژەوانە یەکێکە لە بەهائیەکان ، دلدار زۆر بە احترامەوە باسی ئەم وێژەوانە دەکات‌و زۆر بە هرە لەووتارەکانی وەردەگرێ

وەبۆجاری دووەم لەبەغدا لەمانگی کانونی یەکەمی ١٩٤٠ چاوی پیی دەکەوێتەوە کتێبی (بهاءالله والعصر الحدیث) ی لێوەرئەگرێ وبۆ جاری دووەم زۆر بەوردی ئەیخوێنێتەوە چونکە جاری یەکەم بەکوردی لەسالی ١٩٣٧دا خویندبویەوە ، کتیبەکەی پروفیسۆر ئەسلیمند داینـاوەو خوالێخۆش بو محمود جودەت کردویە بەکوردی) جادلدار هە چەند لەهەندێك رووەوە زۆر بەم دینەهەلدەلێ بەلام لەهەندێ رووی ترەوە ، بەتایبەتی لەرووی مسألەی أسـاسیـیەوە ازلیەتی کۆنو پەروەردگار کەهەردوکیـان لەلای ئەوانەوە یەکشتن ، رەخنەیان لێئەگریێ • باسەفەلسەفیەکە لەژێر ئەم ناوەدا بەعەرەبی نوسراوە

(فی طریق الی معرفة الحقـائق)

(انتقـادات الی قلب البهـائین)

بەراستی باسێکی فەلسەفیو آیینیو زانستو زۆرزانایانە رەخنەیان لێئەگرێو سووریشی دەکانەوە باسەکەنامیلکەییێکی لێدێـتە بەرهـەم

دلدار بێجگەلە کـومەلە هەلبەستەکەی ئەمشوێنەوارانەشی بوبەجێ هیشتوین : ـ

١ ـ فی طریق الی معرفة الحائق : باسێکی فەلسەفیو لاهوتیە رەخنە لەبهائیەکان دەگرێ هەروەکـو

---

١ داخەکەم رقابەرێگا ای چاپکردنی ئەودوو هـەلبەستانەی نەدا : ـ

١ ـ ئەیرقیب ٢ لیرەگەرچی ئەمرۆ

باسمان کرد .

٢ ـ ووتاریکی کوردی بەناوی « عمرخیام » نوسراوە ، بەشیکی ئەم ووتارە بەدووجار لەگەلاوێژا بلاو کرایەوە .

٣ ـ زمانی کوردی وادبیات : وتاریکی زۆربەنرخە بەزمانی کوردي نوسیبیوە هیشتا بلاونەکراوەتەوە زۆرجوان تیتدەگەیینێ ئەدەب چیە وزمان چیە ، جیاوازی چیە لەمیانیانا وەبەراوردیشیان ئەکا لەگەلٚ موسیقا وپەیکەرو وینەکیشی دا .

٤ ـ ناگۆزوری کومەلایەتیمان : ووتاریکی کومەلایەتیە بەشیکی لەگەلاویژدا بلاو کراوەتەوە .

٥ ـ اقتصادنا الوطني : باسیێکي ئابووري و سیاسیە لەتوتن ئەدوێ بە زمانی عەرەبي نووسیوە .

٦ ـ مذکراتی یونس رەئوف ( دلدار ) : لە دووا سالی حەقوقدا دەستی بەنووسینی کردوە ، مێژووي ژیانی خۆیەتي هەر لەرۆژي لەدایك بونیەوە تادەگاتە سالی ١٩٣٦ ، لەگەل بەسەرهاتێکي مێژووي بنەمالەی خادم سجادە .

گیویی موکریانی

## ( ئەی‌لاو )

ئەری ئەی‌لاو لەهیچ وەختێ نەکەی مأیوسی ژینت بی
دەبی هەردەم عەزمدارو دەوای دەردو برینت بی
لەمەیدانی تقدمدا تەلاش ئەسپی نەجاتت بی
لغاوی ئەسپەکەت ( فکر ) و ( علم )ئاوزینگو زینت بی
بەڵێ دایم هونەرمەندبە لەمەیدانی نەبەردی‌دا ،
بەهۆی عەقل و هونەر مەندیت دەبی تیشکی زەمینت بی
لەنیو گەل‌دا نەبێ اعلانی جەنگی‌کەی لەگەڵ جەهلا
علم چەك بێ لەئەم جەنگە وەتەن جیگای کەمینت بی
لەریگای شان و بەرزی‌دا دوورئەندێشیێکی وریابە
منافع پەروەری میللەت ئەبێ ئامانجی ژینت بی
نەکەی بو بەرزیی ئەنجامت برای خۆێنیت لەبەندێ کەی
بەبەرزی شادو مەسرورو بەنزمی‌ژینی شینت بی
لەوەختی گەنجی گەنجی‌دا دەبێ رەنجێکی گەنجی دەی
ئەوەك وەختێ برەنجێنی لەنێو جیێگاو نوینت بی

لەدنیادا حەقیزینت هەیە تاکو نەفس دانێی
بەلام چاکو رەوشتی چاك دەبێ ئایینو دینت بی
برای تۆ نە هەمو کوردێك وەکوو ئالەن کەناچەی کەی
نەکەی دڵ پیس وجوین دەربی بەرامبەریان وەرینت بی
ئەگەر لاویکی کوردی تۆ دەبێ دڵ پاکو بالا بی
نەوەك «دلدار»ی دڵ پەروەر دلت قورآنی دینت بی

## ئومێد

چاوەکانم لێڵو ویڵ بون گواستارەم دەرنەکەوت
دڵ لەتاوی دەردی گلێەی سەندوە گوئاور و نەوت
رۆژ هەلاتو زیندەگی دا گشتی عالەم کەوتە ئیش
چاوە نۆری أفقی دورم رۆژی من کوا؟ دەرنەکەوت
ئەی خودایە تاری نیگبەت کەی ئەبێ لاچی خودا؟
تابەکەی چەنگەچرری من سالەگەل تۆ هەشت حەوت
بەسیەتی (دلدار) زەمانی شعری بی مەعنانەما
هەڵسە چارەی دەردەکەت کەبێ تفکر ریگەچەوت
بێتو ئەسپێ چەند أصل بێ سواری چالاکی نەبێ
قابیلە دەرچێ لەمەیدانی جدالو جیگەرەوت ؟

# ئەی کورد

ئەری ئەی کورد لەنێو گەلدا ھەتاکەی ماتو داماوی ،
کەعالەم سەربەخۆن گشتی ئەتۆش بەیوەندی نیوداوی
دەسا بیری لەحالی خۆت بکە وھەستی بەزیللەت کە
بەلی دوێنێکە راوکەر بووی و ئیستا کەبەخۆت راوی
کەمەر بەستن لەنیو گەلدا بناغەو پێشرەوی ژینە
بەتیری کینەیە ئەمرۆ لەژینا فەوتو کوژراوی
دەساھەلسە بەھوشیاری نەفەوتاوی بەیەکجاری
لەنێو بەندی معذب دائەمینی قورر بەسەرماوی
زەمان ئێمە بەشیشی غەم لەسەر ئاور ئەبرژێنی
سەری سوررما لەجەھلی تۆ ھەتاکەی تۆ ئەبرژاوی
دەمی (یور)ە دوی (دارە) بەلام گەلی ئەویش دارە
بەھۆی کوردە ئەتۆ غافل کەوائەمرۆ شکانراوی
دەسا غیرەت کە مەوھومی لەبەھرەی ژین مەحرومی
درێغ و حەیفە مظلومی کەرێندوی پەشمەفەوتاوی
جیھان گیرانی ھاو تیرەت کەدوێنی ھەروەکو تۆ بون
ئەوان وا پێگەیشتوون و ئەتۆش ھەر کال و ھەرخاوی

## بۆ گۆڤاری ڕوناکی

ڕوناکی ناوت چەندە لام خۆشە
عالەم بەسایەت دلی پڕ جۆشە
تاریکی ڕۆیی دەرکەوت ڕۆناکی
بەعلم و فەن و ڕوخساری پاکی
شوعلە بەخشی کرد لەکێو و بێستان
زیندوی کردەوە عیلمی کوردستان
بەهۆی ڕوناکی هەلستاین لەخەو
بەرێمان یەخست نەحسی و شومی شەو
مژدەبی وەتەن خاکت ڕوناك بوو
بەسایەی شەوقی لاوت چالاك بوو
نەحسی و شووم ڕۆیی لەسەر لێوانت
ڕوناکی جێی کرت لەڕوی جوانت
ئومید پەیدابوو بلاوبێتن فەن
بنوبنین خزمەت گوزاری وەتەن
میللەت ! ڕوناکي مایەي ژیانە
نۆبەي چالاکي لاوي جوانە
انجا سەیری کەن هونەری قەلەم
تاکو بەرزی کەین عراق و عەلەم
خودا ڕوناکی دورکەي لەشقاق
شوعلە بەخشی کەی لەخاکي عراق

# فەلەك

## لەگەل (عونی) دایناوە

ئەوی کەس بێ فەلەك دایم لەخوینی خوی ئەگەوزێنی
کەپەنجەی شێری نیگبەت‌هات رەگی آثاری دەردێنی

لەژێر پەردەی صفابەخشی لەساقی بی‌دەسی گەردون
بەخوشی مەی هەزار عاقل خەیالاتی خەمی دێنێ

کەطالع رۆیی نیگبەت‌هات طبیعەت قاعدەی وایە
لەچیمەندا چەقەل هەلسێ ئەبێ شێریکی بشکێنێ

لەسایەی بەختی بەدبەختی زەمانە هەرکەسی کەس بێ
نەمای داری ئومیدی بەسەد میحنەت ئەلەرزێنێ

دەسا تیرەی بەشەرسەیری لەپەردەی سینەمای ژینا
بەرەنگی سووری خوینی کەش چو گولگون رەنگی دەنوینی

غەرق بوونی هەموکەس هەرلەنیوئاوە بەلام بومن
بەعکسی قاعدەی عالەم هەواماسی دەخنکێنێ

ئەگەرچی خوێن رژان ناخوشە ئەمامن لەلام خوشە
ئەگەر خوێنێ رژا ئەمرو سبەینێ لالە ئەروێنێ،

لەنیو دنیای ئەمەل (عونی) بەعزمێك و نشاطێ بە
دەسافەرزە ئەتوش (دلدار) دلی سستیت بفەوتێنی

# ئەی خودایە

ئـەی خودایـە حالی عالەم حـــەق شایانـی نیە
میحنـەت و ادباری زۆرو شەهدی بێ ژانی نیە

سا ئەزانی بۆ چ ئەمن وامعرضی شکوائەکەم
تا بزانی قدرەتی تـــۆ حـــەدی وجدانی نیـە

زامەکەت بێ مەرهەمو بـۆ گشتی عالەم ساریە
دەردەکە زۆر نـێش دارو قطعی دەرمانی نیە

ریگەیی بەش کردنی رزقت لەدونیـا شاهدن
هێندێ کەس افرادی لورت وهێندی کەس نانی نیە

رۆژێ فەرموت (لیس لـلانسان الاماسعی)
هیچ کەسێش هێندی فلاحی ئیش و کیلانی نیە

ئیش ئەکات و رەنج ئـەدات و رووتو قوو توزگ بەتاڵ
ئاخری بێ سود ئەمێنـێ سال کەبارانی نیـــە

دائەمێنێ رنجەرۆو دەس لەژنەنۆ قورر بەسەر
راستە شاهی بێ شەریك باکی گەدایانی نیە

سا بەرێگەی ژین دزینی مەرڕەکا گیسك ئەبا
چونکە برسی و بێ نەوایە مایەیی مانی نیە

رۆژی هات و روحی دەرچوو لاشەکەی کەوتە ئەری
لێی ئەدەن بەم گورزە گەورە واکە ئیمانی نیە

سا بەسایەی قودرەتت بوو ماڵەکەی بێ بەهرەما
خو قضایە سرقەتی کرد راستە گومانی نیە

بۆچ لەدنیا رنجەرۆ بێ بێ نەوابی آخرت
چونکە وەك من غائلەی دڵ عزەتی گیانی نیە

گەر لەافلاکا هەبایە حاکمەکی تر بەر قەرار
سا ئەچوم ئەمووت: « خودای من سودی انسانی نیە »

رەنگە کەمدیدە و مەلایان هانی خەلکی وابدەن
کوشتنی (دلدار) حلالە چونکە ایمانی نیە!

(( مەی ))

مەی لەبەر دەملی کەئیمرۆ عادەتیکی جاریە
عادەتی چی مؤنسی چی پیشەیی بێکاریە

جامی یێکەم فرر ئەکەیت تۆ هەستی داشادی دەکەی
شادو نۆشی چی بێ یاران عیللەتیکی ساریە

عیللەتە صحەت ئەبا غارەت گەرێکە نیگبەتە ،
لازمە تەسلیمی کەی تەسلیمی کەی ناچاریە ،

هەرکەسێ ادمانی مەی کردخوی ئەخانەداوەکەی
ئاخری هەر رنجەرۆیە هەم لەعزەت عاریە

فەرقی انسانو ولاغ ئەندێشەیە ، ئەندێشەیە
بونەمانی عەقل وادراك مەی دزێکی کاریە

چەن کەسیکم من ئەناسین خاوەنی جاهو شەرەف
ئیستە منکوبی شەرابن پیشەیان غەمخواریە

صحەتو مالو شەرەف رۆیی لەباجی بادەیان
عەیشو نۆش هەر زیللەتە تائاخرت یەکجاریە

ئەی نەکەی گیانە بنۆشی ئەم ئەداتەی مخربە
چونکە ناوی خۆشو کاری عەینی ژاری ماریە

# لاوی کوردان

تۆئەزانی ئەی وەتەن ئیمرۆکە بۆچی بێ بەشی ؟
بۆچی دەستی‌شەو نیشانی تۆئەدانامەی رەشی ؟
پێت بلیم ئەسبابی گەورەی زیللەتو چارەرەشی ؟
گەنجی کوردان هەرلەدەوری مەی أکەن غیرەت کەشی ؟

وەختی بادە دێتە مجلس ناوی کورد دیتە زوبان
ساوەرە سەیری فکرکەو ئاخ‌وداخی لاوەکان
رەنگی ناڵەوالەگوێچکدا ئەلێتن بێ گومان
لاوی کوردان هەرلەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

والە گەل دەنگی تفەنگ‌و ئاگری دەورانەدا
والەگەل ناڵەی وەتەن گەردێ لەئەم زیندانەدا
دیتە گوێم دەنگی بەسۆز هاوارئەکا لەم آنەدا
لاوی کوردان هەرلەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

ئەسلحەی هەرمیللەتێ سادە ستو بازوی گەنجیەتی
رۆژی شوعلە بەخشی ئومید فکروکاری گەنجیەتی
مەرهەمی زاموبرینی کردەوەو هەم رەنجیەتی
لاوی ئێمەش هەرلەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

چونکه میللەت بێتو لەش بێ لاوه روحی ئەم لەشه
بێتو ئەم روحه ئەمینێ ئەولە ژینا بێ بەشه
عەینی دەردە کورد کە کەوتە دەردی کاری داوەشا
لاوەکانی هەر لەدەورەی مەی ئەکەن غیرەت کەشی

میللەتێ گەر گەنجی سست بێ مردوە عیللەت نیە
تا کو مابێ نیو دەرونی بێ جەفاو عیللەت نیە
شادمانی تەختی ژین و تاجەکەی عزەت نیە
لاوی کوردان هەرلەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

میللەتێ گەر لاوی چوست بێ زیندوەو هیچ نامرێ
هیچ بەزی میللەت دەستو پایان والەبەندی ناخرێ
سەدهەزار تیغی زەمانە بێتو ئەستوی نابررێ
لاوی ئیمەش هەرلەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

عەیبە عەیبە لاوی کوردان سەیری لاوی غەیرەکەن
فکری بێ باکی بەسەرچوو سالەکەللە تەفرەکەن
دەوری نوستنتان بەسەرچوو سەیری ئەمناو دەورەکەن
عەیبەچی تر بەس لەدەورەی مەی مەکەن غیرەت کەشی

سەیری ناکەن لاوی غەیرە گشتی بازووی قوەتن
گشتی سودبەخشی وولات و مەرکەزی سەدهیمەتن
بۆ بەجێ هێنانی کاری جوان لەرێگەی میحنەتن
عەیبەچی تر بەس لەدەوری مەی مەکەن غیرەت کەشی

لاوی غەیرە دێنە سەرخۆ جانفیدا کاری ئەکەن
بۆ ژیانی نیشتمانیان گشتی خوێنکاری ئەکەن
جالە بۆ فەوتانی دوژمن راوی ئەغیاری ئەکەن
عەیبە ئێوەش هەر لەدەوری مەی مەکەن غیرەت کەشی

سەیری ناکەن چەن بەتینە دەستی لاوی غەیرەوا
بێتو وەختێ قینی هەلسێ و کولەمشتی ٠٠(١)
والە ترسانا ئەلەرزن گاوی گەردونو سەما
لاوی کوردان بەس لەدەوری مەی مەکەن غیرە تکەشی

واشعاری عصری بیستەم هیمەتە هیمەت بکەن
میوەیی داریکی هیمەت خزمەتە خزمەت بکەن
مەرهەمی زامو بریتان قدرەتە قدرەت بکەن
ئێوە تاکەی هەر لەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

(١) ووشەی دوایی ئەم بەیتە لەمسوەدەکەدا نەماوە وخوراوە

سەیری ئەحوالی وەتەنەکەن چۆن زەبوون و مردوە
سەیری کاری دەژمنانەکەن چی بەحالی کردوە
سەیری رەشمالی زەلالەت ئاسمانی گرتوە ،
ئێوە تاکەی هەر لەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

سەیری باغانی وەتەنەکەن ووشکە کەوتونە خەزان ،
سەیری غونچەی نەوشکوفەی چەند بەبێ نازهەلوەران
شاهدی بی‌کاری ئێوەن واکەوا ئاوی برران ،
عەیبە تاکەی هەر لەدەوری مەی ئەکەن غیرەت کەشی

عەیبە ئەی لاو خاوەنی ئەم شاخ و داخی کوردی تۆ
خاوەنی تاریخی خوێنین و دلێری و گوردی تۆ
عەیبە بێ‌کاری هەتاکەی سەیری ناکەی مردی تۆ
عەیبە چی تر بەس لەدەوری مەی مەکەن غیرەت کەشی

هەڵسە ئەی لاو تیت گەیێنم میللیەت معنای چیە
تابزانی لاوی غەیرە مذهب و ریگای چیە
یالە بۆ ئامانج و ژینی کردەوەی هەمتای چیە
هەڵسە بێبە بەس لەدورەی مەی مەکەن غیرەت کەشی

میللیەت یعنی بەنووکی رمبي دوژمن بێیەهوش
سەیری اطرافت بکەیتو دانیشی هیندی بەرۆش
ئاگری هەستی بەزیللەتتان لەدڵدا بێتە جۆش
هەڵسی انجانەکە لە دەوری مەی بگەی غیرەت کەشی

میللیەت یعنی لەزررەی توقو رنجیر راپەری
توقی یەخسیری لەئەستۆی خۆتو میللەت لابەری
بێیە سەر خۆتو بزانی تۆلەریگا لادەری
هەڵسي انجا بەس لەدەوری مەی بکەی غیرەت کەشی

هەڵسە بێکاری هەتاکەی بێ حقوقو بەندکراو
هەڵسە بێکاری هەتاکەی هەی لەژیر خاك دارزاو
هەڵسە بێکاری هەتاکەی، معرضی اهدافی داو،
هەڵسە، هەڵسە، بەس لەدەورەی مەی مەکە غیرەتکەشی

هەرکەسێ پشتی بەگەردون بەستبێ پشتي شکا
هەرکەسێ چاوی لەدەستي اجنبی بو کوێرکرا،
کامی لێ دەربوو لەریگەی سەر بەخۆی داژیا،
هەڵسە، هەڵسە بەس لەدەوری مەی مەکەن غیرەتکەشی

میللەتێ گەرخوێنی نەرژێ دەستو بێ ی ناکرێتەوە
بێ کبفاچ گوفتار وثیقەی ژین پێ نادرێتــەوە
بــادەو مــەستي مقــامی حریەت نــاگــریتەوە
هەلسە ، هەلسە ، بەس لەدەوری مەی مەکە غیرەت کەشی

## ( ئیش )

دڵ بەدووی ئەفسانە کەوتـو وای ئەزانی واتەبــێ
ئیشی دنیا رەنجی بێ ناوی بەخۆی کوتاتەبــێ
ئەی دەزانی ئەو بەآرەق داری ئەمیـــد ئاوبدا
گەر بەخوێن پەینی بکا ئەوجاسەمەر پەیدانەبــێ
لفظی (نــابی) نابی بیزانی کەلاوی کوردی تــۆ
هەر بەکــوشش دیتەبەر باغی ئەمەل احیاتەبێ
(طالع) و (اقبــال) موەهمی پایەبەندی بی هونەر
عەزمی مەردانەت بێ هەر چیت نیازبێ واتەبێ
ئەی برالادە لەفکری کۆنو زووسا راپەرره
کارەکەت چارێك بخەرەبجت هەبێ خۆی چانەبێ
مردنەژینـــت بەبێ کاری لەسستی لابـــدە
هەربەرەنجی لاوی وەك تۆ نیشتمان ئــاوانەبێ

## ( دل )

## لەگەل (عونی) بەیەکەوە دایانناوە

دل لەبەینی طلعەتی رووو زولفەکەی دەیجوورتە
گاهێ مەیلی شەو ئەکات و گاهێ مەیلی نوورتە

بەحری عمانی سروشکم وابەدەم گریانەوە ،
پرلەدانەی گەوهەرە هەم لەعلی وینەی سورتە

بادەکەت پرر ژەهری مار بێ پیم بدەی نوشی ئەکەم
چونکە طبعم هێند مطیعە بەندەیی میسوورتە

سائەزانی چەند بەشیوە ئەودلەی بیماری من
پەی کراوی تیری غەمزەی چاوەکەی مەخموورتە

ئاسمانی حسنی روخسارت لەئەبرۆ وچەرخی روو
تاقی ئەبرۆت دوو هیلال و چەرخی کولمەی خورتە

خونچەکەی نەشکفتەیی لێوت لەباغی مقصدم
تادەمی پشکوتنی دل بولبولی منظورتە

ئارەزووی ئەم شعرە ( دلدار) تولەعونی بوئەکەی
چوونکە ئەم غەمبارە دایم بووتەئەن مجبوورتە

## بۆئەو کەسەکە ...

لەبن سایەی چەمەن زاری بەهاری
باپێکەوە بین یەك دڵو رووخۆش
دڵڕوونو خرۆش ، باراوێ بکەین سا
هەڵبەستە منو تۆ ، دڵی پڕجۆش

تەنهایی بیابانێکی پرر سوز ،
جالەریەوە ئاوازای زەمین سولی سرور
سابەسیە غرور ، ساتێ ببیەین سا
منەی دەمی دڵداری و تودەنگی طیور

خزمەتچی نیازمانە شتومەك لەژیان
تحفەی دەسی دڵدارییە بەنرخو بەها
پەروێزو معلا ، کاتی بچنین سا
من بەستەیی پەرجەستەو تۆنیر گزی شەهلا

پرر زەمرەمە باغیکەزەمین تۆم هەبی بەدەم
خوش نەشوە چ جامێکەژیان ساغری گلکون
تۆ شعری مجسم من شاعری ملهم ،
تۆ حسن و فسون من هەمدەمە مەفتون

## ﴿ قەل و رێوی ﴾

یەك لە پەندە خۆشەكانی ﴿ لافونتین ﴾ ی
شاعری ئێسك سووكی فرەنسە یە كردومە بە كوردی

ڕۆژێ لە ڕۆژانا قەلێ — راوەستا بو لە سەر چلێ
سەلكی پەنیری لە دەنووك — ویستی كە بیخوا لە هەلێ
ڕێوی بەلایا تێ پەڕری — چاوی بە قەل كەوتو مەلێ
ویستی بەفێلێ لێ سەنێ — دەسی پێ كرد پێی هەل بلێ
ووتی : ئەی بولبولی زەمان — ئەی نەغمە خوانی سەر تەلێ
بیستوومە من ناو بانگی تۆ ! — تو خوا گورانیم بۆ بلێ !
قەل وەختی زاری داپچڕان — پەنیری كەوتە بن تەلێ
ڕێوی پەنیری قوزتەوە — بەلام لە پێش ئەوەی هەلێ
ووتی ئەوجا بە سەرنەفام — گوێت لێ بێ ڕێوی بوت بلێ !
وەختێ شتێكت گرتە دەم — كەرمە بە گورانی مەلێ
ئەمەیش كەرانە بێ كەوا — تەفرە دەراوی تۆ چە لێ

---

## شعارم لەژیانا ئەمەیە

بەلێ خۆشە ئەمەل گەر بێ لەسەر ئەم ڕێگە یەرەنجدەی ،
بەلام گەر هەر خەیالات بێ ئەوی هەت بێ ئەویش ئەروا

( دلدار ) 

# ﴿ کوردستان ﴾

کوردستانی خۆش ، نیشتمانی جوان
تو قیبله گاهی منی بێ گومان !

چاوم پشکووتووی شاخەکانتە ،
فێری ژیانی باخەکانتە

دەنگی شمشاڵی شووانەکانت
زریق و باقی جووانەکانت ،

قاسپەی (کەو) انی قەد کێوەکانت
خوڕڕەی ئاوەکەی نشێوەکانت

ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە
هەوێنی شعری دلیان گرتمەوە !

نەونەمامێ بووم لەم خاکە رووام
بەخۆشە ویستی وولات ئاودرام

بەڵێ کوردستان تۆ منت خولقان
تۆ منت خولقان بێت بەخشیم ژیان

خۆشی ژیانم خۆشی ژینتە ،
ئێشی ژینی من رۆژی شینتە !

چونکە کوردستان ، نیشتمانی جوان
تۆ قیبله گاهی دڵی بێ گومان !

## رۆڵەی تازە

من رۆڵەی کوردستانم     تازە رۆڵەی کوردانم
تاکو وولات سەرکەوێ     فیدایە رووحو گیانم

پێویستم بەزانینە     زانین باغەی ژینە
گەرکەلێ بێ زانین بێ     گەرزیندوش بن مردینە

ئێمە بەیانی گەنجین     لەم خاکەدا لەرەنجین.
رەنجدان نیشانەی گەنجە     ئێمەش خولقاوی رەنجین

وەتەن باخی جینانە     محتاجی بازوو وشانە
هەرکەسێ کوشش کەر بێ     لەم باغە باغەوانە

وەتەن محتاجی تۆیە     ریگاکەت جوستوجۆیە
میللەتێ سست بۆییتن ،     لەمەیدان وەکو گۆیە

# ﴿ مندالی هیوا ﴾

مندالی هیوا ، کوولەکەی دلان
تازە غونچەکەی نیو باغی گولان !

هەرچەندە سەیری نیو چاوت ئەکەم
نابینم گەردێ نەزۆرو نەکەم

روونی چهرەی تۆ وەك ئاسمانی ساو
وەختێ ایێ دابێ پرشنگی هەتاو

تیشکی ئومیدی سەردلێ تاری
لەئاسمانی رووت ئەدا دیاری

سیوەیلی چاوی بریقە دارت
رووناکی پاکی وێنەی روخسارت

خەندەی بێ فێلی لێوە ئالەکەت
نەشئەی دووچاوی مەستو کالەکەت

بێ شك پێشەنگی موژدەی دلشادین
یانەغمەخوانی باخی ئازادین !

ئومیدی دوارۆژ ، رولەی هیوا ، تۆی
خاوەنی فیکری بیکرو بالا تۆی

هیوام بەتۆیە ئەی تازە نەمام
بەیانی ببە ئوونەی میسال

ئەم قسانەی منکەوا بوت ئەکەم
بزرینگێ تەوە لەگوێتا هەردەم
راست گۆبە دایمقەد درۆ نەکەی
وەختت بەبێسود تۆلەدەس نەدەی
تێکۆشە دایم هەروەکو هەنگ بە
لەمەیدانی ژین ئامادەی جەنگ بە
ئەوابێت ئەلیم چاکی بزانە
ژیانی مەردی باری گرانە
نەك وابزانی وەك ژینی دوێنێ
دەخۆی و دەنووی لەناو نووی
ئەوە ژین نیە کەوەك ژن بژیت
ئەبێ هەمئازاو هەمەزن بژیت
رۆژی کەهاتو تۆ پی گەیشتی
چاوت کردەوە لەژین گەیشتی
ئەبینی ژیان کێویکی بەرزە
ریگەی خوارو بەترس و لەرزە
گشت کەندو کۆسپ،دەوەنە ، دارە
پر لەدررندە دوپشك و مارە 

سەر ریگەت هەموی دانەیەو داوە
نادان ودانا لـەوا داماوە !
گیانەکەم ئەبێ تـۆلەم رێـگـایـە
لەمدانـەو داوە وچەرخو دەزگـایـە
گەلێ ماندووبی ، آرەق برێـژی
ئەمدەردو ئـێـشـە یەکـیەك بچێژیی
لەرێی سەرکەوتن ئەبێ پێش کەوی
هـەتـا بـکەوی زیاتر سەر کەوی
نیشانی تیرەی خۆت بدەی رێـگا ،
گەریز ببـەستن برۆن بـەشـوینتا
تۆئەبی چرای زانستی هەلـکەی
دەسم داوێنت ریـگـا وون نەکەی
ییرو هۆشی خۆت بەکار بیهێنە ،
ئـەمدانـەو داوە یـەك یـەك ببـێنە
تاکـو دەرکەوی لەهەمو دنـیـا ،
چەندیان کرد بمرێ کەچی کوردهەرما

# ئەی بادی شەماڵ(١)

ئەی بادی شەماڵ ، ئەی بادی شەماڵ
پۆستەی هەوایی دڵەی پڕ زوخاڵ

دەستم دامێنت ئەچی بۆ کوێندەر
ناچی بۆ کوێ مأوای دولبەر ؟

وەك عارەب دەخیل گەرچووی بۆ ئەولا
مەوەستە تاکو بەردەمی لەیلا ،

مەوەستە تاکو لای شوخێکەوا
تیری نیــو نیگـای لەدڵدا روا

لەم چەمو بیشەوهەردەو کێوانە
بێی بلی قوربان لەم ریگەو بانە

شێتێکی رسواو ،رووتو قووتم دی
فرمێسکی ئـالی وەك یاقووتم دی

روو لەخوێن خالی زەعفەرانم دی
چاوی لێڵو وێڵ پڕ گریانم دی

هەیکەلی مردووی بەس ئیسقا نم دی
قـەدی چـەماوەی وەك کەوانـم دی

(١) ئەم هەلبەستە لەدیوانە دەسخەتەکەی دلدار بەم جۆرە نوسراوە کەجیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی کەلەشمرو ئەدەبیاتی کوردیا نوسراوە

دیتم کەجارجار ئەولێو بەبارە
دەست هەڵئەبرێتو توی لێدیارە
چونکە خەیالی بەژن و باڵاکەت
تیشکی رووناکی شەوقی لالاکەت
نیرگزی شەهلای چاوی خومارت
خەرمانەی زولفی ماهی روخسارت
فریشتە ئاسا ساتێ هەزار جار
خۆی نیشان ئەدا خۆی ئەدا حەشار
ئیتر هەر جارە ئەومالٚ ویٚرانە
ئەوکەژ مەسکنە هەژەی شارانە
هەروا تێئەگا جەژنی وصالە
نازانێ (تۆ) نیتوینەی خەیاڵە
دەست درێژئەکا بەناکا مەوە
بەجەرگی سووتاو دل بەزامەوە
کەلێی وون ئەبێ بانگ ئەکا هەی یار
بە کول ئەگرێ هاوارەی هاوار

## ﴿ ئەی نازەنین ﴾

ئەی نازەنین ڕەوای تەوبجی نازەنین خوٚنازەنین

بیستم ئەڵێی کە بێوەفام

بێشەرمو ڕەنگو ڕوو وەلام

لە بانیـکا هەزار هەوام

بەلام ئەگەر بەمچەشنە بام

لەمسەنگە ساریە چوٚن ئەمام

بەڵێ لەلای ناحەز وەهام

**بەلام . . . بەلام**

ئەمن گیروٚدەی داوی توٚم

گیروٚدەی زولفی خاوی توٚم

دەبەنگو مەستی چاوی توٚم

مەلیکی باڵ شکاوی توٚم

بەشێتی ناو زرراوی توٚم

خودا پەرستی ناوی توٚم

ئەی یاری خوٚم

کەتیشکی تۆم لەزوو پڕا
گوڵی ئومیدی پێی بوڕا

زوخاوی بەستی لێی رژا
عالەم لەتاوا پێی هەژا

شیت بوو بەجارێ تێك‌قوا
هەمانەی پەندی هەڵرژا

چ هەڵرژا !؟

جا جاڕی داکەسەر سەریم
لەرەوشتی چاك بێ بەریم

ناوی زڕاندوە بەد فەریم
بێ عەقڵو لاملی، گرریم

دووروووودوو پشت‌وزوروەریم
نیشانەی چاکەو بێبەریم

دەربە دەریم !!

ئەی نازەنین

رەوای ئەم‌تازە نازەنین

خۆ تازەنین

## ﴿ کۆترە باریکە ﴾

ککوو . . ککوو . . کوو . . کو . کوو    بەسیە نوستن خەوالوو
چاو هەلێنە هەلسە زوو    هەلی ژینت لەدەست چوو
ککوو . . ککوو . . کوو . . کو . . کوو

تیشکی زیرریٚنی روژسا    لوتکەی بەفرینی چیا
روون کردو تاری نەما    لەزەنگی زیندەگی دا
ککوو . . ککوو . . کوو . . کو . کوو

هاوەلم هەلی بچووك    لەخەو رابەرری چاپووك
بوخەبات چوستو لەش سووك    کەوتە گەرران وەکمەکووك
ککوو . . ککوو . . کوو . . کو . . کوو

لەلای عالەم نیٚوە رروٚ    هیشتا شەوە لەلای تۆ
بێرەنج کێ ژیوە ئاخوٚ    نوستن وتەمبەلی بوٚ
ککو . . ککو . . کوو . . کو . . کوو

ریگەی ژیان وەك سەفین    هەورازو سەختو بەفرین
ناوخوشو بارگران ژین    هەلسە لەخەو بانەمرین
ککو . . ککوو . . کوو . . کو . . کوو

ککوو . . کوو . ککوو . کوو    بەسیە نوستن خەوالوو
چاو هەلیە هەلسە زوو    هەلی ژینت لەدەس چوو
ککوو . . ککوو . . کوو . . کو . . کوو

## لەگەڵ جاهد پێکەوە دایاناوە

شەهبازی پاشەهینی ، شاهی پاشەهلاری تۆ
بێدلی بێمرووەتی عاشق‌کوژی خونخواری تۆ

ظالمی غارەتگەری تالاّن بەری بۆ گیان و دڵ
لەشکری تاتاریە دوو زولفەکەی تاتاری تۆ

حاکمیکی مەست و بی باکی ئەبەد رەحمەت نیە
مائلی فنانیە دوو چاوەکەی سەحاری تۆ

نوره بو کشتی عالەم ظلمەتی دووزولفەکەت
ظلمەتە بومن بەتەنها نوەری روخساری تۆ

بەسیەتی جانەی صەنەم باباری میحنەت لابەرین
کەعبەکەچ نابێ کەساتێ بێینە نیوگولزاری تۆ

مجلسی مەستی بیەستین خۆم و خوت ئەی نازەنین
کەی ئەبێ جاری بیم من مەستی شەکرباری تۆ

قەت نەکەی (جاهد) مەدە دلەم شوخی واکەچ مذهبە
چونکە (دلدار) م ئەزانم نایەتە هاواری تۆ

## « لەمەیدانی مجادەلەیێکدا »

کەسێ کەس بێ لەدونیادا کەساسی دەستی دەورانە
لەژینانا کەسی بەدکار لەجاهی عزەت و شانە

گوناهی کەس ئەبێ چی بێ بەغیرەز کەسێ سەر بەرزی
بەقەدخەندەی کەسی ناکەس ئەوەندەش ئەولەگریانە

برانابێ تعجب کەی لەوەضعی ناکەس و دوو روو
کەوا أفلاک و گەردوونیش وەکورووی أو لەگورانە

طبیعەت قاعدەی وایە لەگەل گورراو برادۆستە
ئەوی ثابت بێ ساکن بێ لەبەهرەی ژینی حرمانە

ژیان خەونێکە ئەی بینین بەتیژی دێت وئەرواتن
لەپەنهانی نیهانی دا ئەوی دانابێ نادانە

لەهیچی دا بەدی هاتی ، بەرەو هیچیش ئەروی غافل
لەبەینی هەردوو هیچی داخەراباتی بەژی گیانە

عبادەت چی بوو نەتزانی بەغیرەز نێرە بیدۆشە
سەری خۆت بۆدەیێشێنی صفا نسیانە نسیانـە

بەمەستی خۆت لەبەستی عەقل و ئەندیشە ئەوەللاکە
ئەوی رۆییوە زۆییوە ئـەوی نەبوە لەپەنهانـە

ئەری ئەی یاری تەنها ییم ، نەدیمی هەمدەی پەستی
لەگەل تۆم ساقی هەموارو خەلیفەی پیری مەیخانە

دەسا کوا جامەکەی دوێنێت کەقووتی گیانی تیدابوو
دەخێرا تێکە بۆم چونکە لەبەستی مەستی دەرمانە

دەسا (مەی) جامەکەی جامی سەری کەی بی فەلاتون بێ
بنۆشە باوەرریت وابێ کەلەم کاروانە کاروانە

## ﴿ بلی سەربەستی ئەی لاو ﴾

لەساتێکی وەهاتەنگو لەکاتێکی وەها پەستی ،
کەعالەم گشتی هەستاون ئەبێکەی تۆش لەخەوهەستی
بەچاوی راستەقینەسەیری خوتکەیتو بکەی هەستی
کەوامەحرومی سەربەستی لەژێردەستانا ژێردەستی
لەگەڵ لاوی ئەهێنی کورد بلێ سەربەستی، سەربەستی

بەگوڕتۆبێیە مەیدانو حقوقی گشتی داواکەی ،
بەیادی ئەوجەوانانی شەهیدان گیان بەر پاکەی
بەتیشکی حەق خوراوی کورد دلی تاریکی رووناکەی
بزانی سابەسەرچوو وەختی بەدمەستیو بەدمەستی
لەگەڵ لاوی ئەهێنی کورد بلێ سەربەستی ،سەربەستی

لەچاوی کیژەکوردانی . . . ماڵ . . .
شەپۆلی ئەشکی خوێنین دێ وەکوجوباری بالافاو
هەنیکە قولپەگریانی هەتیورووتی باو . . .
ئیداکەی واجبەبۆ گشت لەبۆ دلتینی ئەشکستی
لەگەڵ لاوی ئەهێنی کورد بلێ سەربەستی، سەربەستی

## ﴿ سزاواری ﴾

لەحەسرەت دەردی بێدەرمانی دوریت واپەشۆکاوم
لەشێـوانی جەفائامێزی مأوای دڵ پەشیـــواوم

ئەزانی چیبەعەقڵو هوشی کردم قەشمەری خەڵقی
گەلێجار لیمئەشێوا خوایە چیبێ مبدئی نـاوم

ئەلێن : شێتیوەفای هاودەردی یاریمیهرو دلسۆزی
ئەلێم : ڕاستە ، ئەلێن : گوانێ لەبەحری حیرەتاماوم

دڵێ خۆم خستە سەر سینی سزاواریو لە بـۆتم نارد
کەهاتە بەردەمت داتە دەمی سـەگ گـویا هەر خاوم

رەقیبو مدعیش ئێستا بەلامادین بەگاڵتەو گـەپ
بزانـــم تابەزاری فینتە جــۆلیوا نەجووراوم

لەقاقای پێکەنینی فوزیسەر گەرمی ئەدەن وەختێ
ئەبینن دوودڵوپەی ڕووتو گەرمیئەشکی دوچاوم

لەعانیەزعەتا بووم ووشکەصوفی هاتو لێیپرسیم
وەفات جۆنە ووتـم باللّه لەسەرعـەینی وەفاماوم

لەڕانیەوەلەگەڵ جاهـدی پێـکەوە ئـەم شعـرەمان بـوکانی نـارد
لەسالی ١٩٤٤ دا

﴿ کانی ﴾ ( ١ )

( ١ ) ئەنفیەت کانی دەلین مسك و گولاوی تیـکەلە
داروەکازیشت لەدارستانی گـونـدی هـەرتـەلە
باش ئەگەی تقلیدی لەنجەی . . . . . شەلە
مەیلی ئـەشعـارت وەکـو جارانە ئایا ئەم حـەلە ؟

بیستبوم صاحب زەوق بووی صحبەتت خۆش و بەنام
مجلست دایم بەمەی ئەرشاند شـەوو ڕۆژ بالدوام
خۆش قسەو خۆش ڕووو خۆش خوو مضحك و شیرن کلام
صـەد معـاذالله کەئیستـا بوی بەصوفی دەرگـەلە !

باڕواندنز جالەمەولا قـورڕبـپـێـون سەر بـەسـەر
کانیێـکی پڕدوررو گەوهەروالەنێـوی چـۆتـەدەر
شاری هـەولیرت منیرکرد ئەی شەبوستانی هونەر
( ئاغـە )

---

( ١ ) کانی خـوا لیٚ خـۆش بـوو جبار آغا دوغرەمە چـی بـە

جا لەنیو پاش هەرکە شەودێ پاشی تسبیح وصلات
پرر ئـەدەیتە داسـتانی ( قیـس ولـیلا ) وعصات
وا دەزانی چاوە دێرن مجلــــسی( پاشا )لەرات
ووشکە ڕۆیینت نـەماوە ئیـستە بویتە هروله

. . . دەلـێی من بعـد قاوەك فرئـە کەیت
عەینە کە نایابە کەت انجا لەناو کـیف دەرئـەخەیت
. . . . . . پێت دەلین دەست پێ ئەکەیت
جا لەبەحری ووشکی . . دەست ئەکەیتە پـێ مـەله

قوڕبەسەر مجنون چەهەتکیکت بەلەیلا کردوە
قوڕبەسەر لەیـلا کەقەیست سووکو رسواکردوە
قـوڕبەسـەرمن تاکـوئیستا شاعریت واکردوە
تا « فضـولی » . . (کانی ) . . مـهزله ،

. . . . . . . . . شاعـری »
تۆلەکوێ انشالەکوێ هەی کۆنە صوفی قادری
کونە دەرویشی ئـەزانم تـەقلە بـازی ماعری
. . . . . . . . . . . .

## ﴿ خەندەکەی بابی ﴾

لە ئـافاقی ژیانی ناهومیدیــــم خـەندەکەی بابـی
فرشتەی پاکی هیـوامی نیشاندام واکە بیـدوێنم ،
پڕیشکی تیشـکی ئەستێرەی جوان ئەمشەو بە ئەسپایی
بەسوزێ هاتە نیو کـونجی دلی تاریـکی پڕخوێنــم
دەسادەی مصدری هەستی
دەخـیرا لادەری پەسـتی
وەرە ئامن بەرازی تـۆ نـەمامی شادی بڕوێنـم

جووانی خونچەیـێ بووواکە پەنجەی رازی راکـێشای
دەسەیری چەن بەوەصلی زولفی خاوت شادومەسرورە
لە رووی راستی ئەتۆش وەك ئەو گولیکی چیمەنی دنیای
کەچی تاجی دلی هێشتا دات لەم حالە رەنجـوورە
بەخەندەی نەرمی دل پاکیت
ئەخۆم سوێندی بەرو ناکیت
ئەگەر هەستـێ بەژینوابێ لەجەرگی راستیادوورە

هەموی نووری ژیانـە فیض و نووری ئاسمانی شین
هەموو چەپلەی گوشادی لێ ئەدەن هەرچی کە ئەیبینی
لەسەر ئەم خاکە گەردیکین دەئێمەش روو لەشادی بین

فەرامۆشی بکەین جارێ چەژەی تالاوی غەمگینی
بەدڵ ڕوونیو ڕووخۆشی
بەخەندە نەك بەخامۆشی
بنۆشین جامی دلداری لەبەرکەین بەرگی نەمرینی

دەهەڵسە بابناکەین معبدی پیرۆزی ( دڵداری )
لەتیشکی ڕۆژ لەشەوقی مانگ لەڕەنگی پەلکە ڕەنگینە
کەهەر کامەی بڵێی پاکە لەکردەی قدرەتی باری
نیشانەی کرد گارێکە و بناغەی پەیرەوی دینە
لەشوێنی پڕلەهەستی بێ
کەرەستەی خۆشەویستی بێ
لەنێو ئەمباخەبێ جێگەی کەتۆم لێدیت لەهاوینا

لەپەلکی تازە پشکووتووی نەژاکاوی گولی نەسرین
کراسێکی سپی بێ گەرددروست کەشەنگ و دامەزشۆر
لەبەرکەو زولفی زێڕینت بەسەریا بینەخوار چین چین
پەری تیم تیم بەڕازو ناز لەبۆت بێنن بنەوشەی ..ۆر
بەئاوازو نەواو تەبجیل
بهۆنن پیچەکەی اکلیل
ببەن کرنووش بڵێین: ئەی شۆخ ئەری زادەی گزنگی خۆر

ئەواکابلی دڵسۆزیو دڵئارامیت ئەکەین پیشکێش
کەهەر چەیکەی خەمو ملکەچ سروشتی نەوجەوانیکە
نیگاریێبوو ، بەناکامی ، بەگریاوی بەئێشو نیش
لەژین ڕۆیی ئەوێستاکە هەوێنی داستانێکە
بەیادی ئەودڵەی تینوو ،
کەچۆن هاتوو ەهاش دەرچوو
بررۆ ناوئابدە وسەیری چەپیرۆز جاویدانیکە
وەرە نیوئابدەت تامن لەبەرپێت دابدەم ئەژنۆ
لەبەروەی نا دڵارامی لەبەر وەی چونکە بالای
خودای شعروپەری هیوای بلیسەی هەستی بەرزی تۆ
هەوالی هاو ڕەگو خوێنی فریشتەی شۆخی میدیایی
لەرووی چاکو وەفاداری
بەیادی جامی دلداری
لەمەستی خۆشی بم هێلی دروشمی خەندەکەی بایی

## ﴿ نائومیدی ﴾

زەدەی تیری نیگاهی فیتنە پەردازی نیگاریکم
گـیراوی داوی زلفی مشکباری گولعوزاریکم

ئەوی نەیدیبێ نێشی دڵو یا ئازاری دلداری
چوزانێ من لە ئێشانی چەسووتانو فگاریکم

لە دەشتی نائومێدی دا بە دەم بایی قەدەرهەر وەك
پەلاشێ وام کەهەرسا ئەلە گۆشەیاکناریکم

بەرۆژ ترساوو تاساوی زرەی کاسەی شەوی پێشوم
بەشەو سەرخۆش و مەستی جامی قەهری رو ژگاریکم

ئەری ئەی دوستی دلسوزم بەبێ سوچ منمەرەنجێنە
سەبر دەرمانی دڵ ناکا کەمن پەیوەندی یاریکم

سەرومایەی جەوانی خۆم لەرێگەی رازی ئەودانا
لەدەرگانەی وەفای هێشتا هەژارو لیوبەباریکم

ئەبێ چون پشت بەدلداریم ببەستم تاکو ئیستیکە
گەلێ دوورین لەیەکتر ئەولەباری منلەباریکم

# « لاله‌باس »

ڕۆژێکی پایز لەپێش نیوەڕۆ
لاله‌باسم‌دی زەوی ئەداتەوە
رووت‌و زگ‌والا پیرو تیك‌شکاو
پشتی چه‌ماوه لووت‌لەسەر ئەژنۆ

گوچانی دەستی ، دەستەندوی جووت بو
دەنگی نووسابوو بەهێ‌هێ‌و هۆهۆ
هەی ماندوونەبی لالەجوتیارە
ووتی « هەر بژی ررولەی لەسەرخۆ »

ووتم : کاری جووت ره‌نجی لاوێنی
زۆردوورن لەگەڵ پیریکی وەك تۆ
رەسوولەی کورت ڕەنجبەری چاکە
زەلامی ملهوڕ لاوی چوستو جۆ

کەوابوچی جووتت لەبانی ناکا
بۆچی تۆونادا بوچی نابرێ شۆ
هەندێ هێکەنی سەبرێکی کردم
دەستی خستە سەرریشی وەك یەمۆ

ئاگری دلی لەهەر دوو چاوی
بلێسەی ئەدا وەك جووتی پشکۆ

ووتی : لەهاوین کێخا کاکەسوور
هاتەماڵەوە پێی ووتم : لاوە
شایەدي بدە «زەوی زیرریـن دۆڵ»
گەواهی منە قورآنیش بخۆ
ووتم کاکەسوور بەمسەرو ڕیشە
ئەوبالی خەلقی ناخەمە ئەستۆ
ووتی : هەر وەها بەسەری ئاغا
ئەتکەمە پۆری بەرچەنگیەاو
بۆشەو زەلامی هانارده سەرم
مالیان دامە بەر شیلینگي برنو
سێما نگامەبوو بەتالانی برد
منالی هێشتم بەبێ ماستودۆ
هەندەي پێنەچوو عەزەی صالح آغا
لەسەري کردم بوحصەی تاپۆ
چومە خرابە ووتم : ئاغە گیان
ملکم هینخۆمە قەیدن لەطاپۆ
پێی ووتم : پیرەی سمێل کلاکەسە
یاتاپۆ بدە یابارکەو بڕۆ
دووسێ ڕەش و رووت ولاغیان هێنا
دەغلیان بارکرد بەلێ لێو لولۆ

کێخوای چەمبەریش رەسولەی پەت کرد
کردی بە عەسکەر بردی لە بۆ کۆ
لە کۆیە چوومە لای ضابط وتم
ئەفەندی عومرم گەیە حەفتاو نۆ
بێجگە لەم کورە وەجاغم کوێرە
بەمنی ببەخشە مەمکە رەنجەڕۆ
ضابط تووڕەبوو هەلسایە سەرپێ
فرێی دامە دەربەپالە پەستۆ
پێمووت : لالەباس پارەت بدایە
رەسول معەیل‌بوو بەبێ گفتوگۆ
وتی : پارەومن هەی‌خاکم وەسەر
بریا ئەمزانی ئەی خودایە بۆ ؟
ئەوا چل‌سالە زەوی ئەکێلم ،
فەلاحی ئەکەم هەتاکو ئیمڕۆ ،
نرخی آرەقەی‌روونی ماندوویم
تیکە نانێکە چ نان نانەجۆ
ئەویش بەبێ دۆ

## « گوڵی سوور »

گوڵی سوور ، ئەی کچی نەورۆز ، ئەرێ کام دەس لەباغی ژین
لە بو یەك دەفعە بۆن کردن بە ناکاوی ئەتۆی هێنا
ئەویستاکەش بە ژاکاوی
وەها بێ قەدرو تۆزاوی
لە سەر ڕێگا فڕێی داوی
لە جەورو ظلمی ئەو دەستە پەڕی زادەی بەیان لەرزین
لە دەوری ئەم چڵەی لێی بووی پەپوولەی زەردو سوور گریا
منیش ئەی گوڵ دڵێکم بو
دڵێکی پڕ لە ئارەزوو
بە سۆزی ئاوی حەز تێنوو
لە ناکاو لام فڕی بو لای کچێکی دولبەرو شیرین
ئەویش ڕیشەی لە دەس گرتو بەبێ ڕەحمی لە ژێر پێی نا
بە گریاوی‌و بریندارى
بە ڕوو زەردی‌و غەمخواری
بەبێ ئومێد لە دلداری
گەراوە سینەکەی تارم ، ئەویستاش ئەی گوڵی غەمگین
لە تەنهایی سەرینت بێ ، دەهانێ ئەم دڵە تو خوا !

## تەخمیس

طبیب نەیزانی حالی‌من ، چ جۆرە دەردە دارێکم
بەکام عیللەت گرفتارو لەبەرچی شەو بێدارێکم
وتم پێی عاشقی مأیوس‌و ماتو خاکسارێکم
زەدەی تیری نیگاهی فیتنە پەردازی نیگارێکم
گیراوی داوی زولفی مشکباری گولعوزارێکم

ئەمان مردم لەداخی دڵ لەبەر گریان‌و هاواری
دریغ سووتام لەقرچەی ئاگری ئێشان‌و ئازاری
طبیبی چی ؟ حکیمی چی ؟ بەمن‌چی علم‌و گوفتاری
ئەوی نەیدیبێ ئێشی دڵ‌وەیا آلامی (دلداری)
چ‌ۆزانێ من‌لەئێشان‌و چەئازارو فگارێکم

ئەمن تەنهاو بێ‌پەروا بەلای دەوران هەزاران‌لەك
لەئەم ئاشووبە داماوم بەبێ‌ریگاوو بێ‌مەسلەك
نەجاتم دەی لەئەم حالە بەلطفی خوت خودانی یەك
لەدەشتی نائومیدیدا بەدەم بادی قەدەر هەروەك
پەلاشێ‌وام کەهەر ساتەی لەگوشە یاکەنارێکم

چەسودیکی هەیە بۆحالی ئیستاکەم کەواچوّن بووم
چ دەرمانی دلی چاکم ئەکاروژانی ڕابردووم
ئەزانی چۆنە أحوالم لەدەستی بەختی نەحس و شووم
بەڕۆژ ترساو و تاساوی زڕەی کاسی شەوی پێشووم
بەشەو سەرخۆش و مەستی جامی قەهری روزگاریکم

ئەلین پیم غونچەیی عومرت بەبێ هوودە مەڕواکێنە
ئەوی یەزدان بلێ تقدیر ئەبێ صفحەی مەگەچلێنە
تحمل کە ، فیغان بەس بێ ، بە گریەخوت مەفەوتینە
ئەرێ ئەی ناصحی موشفق بەبێ سود دل مەڕەنجینە
صبر دەرمانی دل ناکا کەمن پێوەندی یاریکم

ئەمەندیاریکی غەددارەو لەتعذیب دانێ فەنانە
لەبێ باکی و اطواری ضحاك سەرسام و حەیرانە
مثالیکت لەبۆ بێنم ئەمن ئەی واعظی دانا
سەر و سامانی لاو ێنیم لەرێگەی رازی ئەودانا
لەدەرگانەی وەفای هیشتا هەژار و لیوبەباریکم

گەلی جار پێی ئەلیم ئەی چاو خەوالووی نیرگزی شەهلا
مەیلکە چۆن ئەسووتێ دل لە کڵپەی ئاگری مەیلا
ئەلێ وەختم چیە ئایا؟ مەویستە سابرۆ بەولا
ئەری چون پشت بەدلداریم بەستم وا من و لەیلا
گەلێ دوورین لە یەکتر ئەو لە بارێ من لە بارێکم

## ﴿ گورانی ﴾

زولفی ئەگریجەی یار
زولفی ئەگریجەی یار، چەندە تەبایە
وێنەی جەمالی یار، لە دلی من دایە
شا بۆی گەدایە
گەداش فیدایە
روح بوی رەوایە
هەر بێ وەفایە
چونکە مەشرەبی یار جەورو جەفایە
سەد ماشاللە یارم چەندە بەنازە
دلم دەسوتێنێ بەم چاوە بازە

گەردەنی قازە
شەهـینو بازە
بوروح دلخوازە
بەوعیشوەو نازە
لێوی پشکووتوە وەك غونچەی تازە
هەلسە چاوەکەم یار وەعدەی جارانە
ئاسمان وەکومن ئەسیری تابانە
شاییو سەیرانە
لەناو رەزانە
رووی چەندەجوانە
وینەی گولانە
بەهارە ئەمرۆکە جەژنی عاشقانە

## « تووتنەوان »

ڕۆژێکی هاوین لەقرچەی گەرما
ئاودێرێکی رووت تووتنی ئاو ئەدا
زەردو بێ هێزو لاوازو نەخۆش
ماڵوێران، پەرپووت . بەدەم لەرزو تا
لەچوار سەر خێزان خۆی و منداڵی
هەرئەویان هەبوو هەڵسابو گۆیا
سەیکە یسێ بکا ، گوزەئاو بێنێ ،
توتن ئاوبدا منداڵ بەخێوکا
بەلەرزە لەرزو هانکەی ماندووی
هەولێکی ئەولاو هەولێکی ئەملا
منیش لەتاوی گەرماوماندووی ڕێ
بەتەمای چۆڕێك ئاوی ساردلامدا

---

داخەکەم مردن ماوەی دڵداری نەدا کەئەم هەڵبەستەیە تەواوبکا .

سەلام علیك هۆکاکەی ئـاودێـر
علـیك السلام پیـادەیـی تەنیـا
ووتـم تـێـنووەم ، ئاوی‌ساردئەبـێ
ووتی : نازانم ماومانە یان نـا !
بىرۆژێر کەپرگـەر لەنێـو گـۆزە
ئـاوی تێـدابوو بیخـۆوە ئـەمـا
نـەخۆشی لـێ‌نە ، گەرتینوویان بێ
بەخێری باوکت ئـاویان پـێ‌بـدە
— ٢ — کەپری ئاودێر
کەپرێـکی دار گەز ، نارێـك دامەزراو
بەپووش‌و گەلای چرو سەرگیراو
بۆپارێز گاری خـۆرە تاوو تـۆز
بەچیخێـکی شرر سێ دەورەی دراو
ناومالی ئاودێر هەرزاڵـەیـێ چووك
دووپارچە بـەرری شررو هەلزراو،

جەڕەیێکی کـۆن ، سێ گۆزەی کەرخیو
چەن هامانی ڕەش ، جامیـکی قوویاو
سیلیـکی تەنك ، خـوانـەیـێ بچـووك
لەولاش مەنجەلیـك ، سەرنخوون کراو
دوولـێـفی شرری چلکنی کون کون ،
سێ پیـاڵەی چاو ، قوریـەکی شـکاو
ئـافرەتێك لەولا لاڵو پاڵ کەوتـــو
بێهـۆش لەبـەرتـا ، لەبـرسا ژاکاو
مندالیـکی لەرر عومر شەش ساڵان
لەپەو رووکەوتوو ، بیمل ، پـەشـۆکاو
منـدا لیـکی ترساواو بێ پەروا
بەدوو پارچە جـــل لەملا داپوشراو
وژەی بای گەرمو گـــزەی پۆلیمیش
تیکەلبوو لەگـەل دەنگی ( بـاووئاو )

— ٣ — دوو سوار

ئاوم کرد وەدەم منداڵی ساوا
ماندوویی و ئێشی خۆم لەیادنەما
حاڵی ئەم ماڵەی هەژارو نەخۆش
ئەرکی سەرشانی ئاودێری تەنها
منیان هاویشتە گێژی سەربجدان
لەکارو باری تاریکی دنیا
ئەم هەموو ئەرکەو ئەم هەموو ڕەنجە
گۆیا لوقمەیەك نانی جۆ ئەخوا ؟
من لەو خەیاڵەو دووبارگیر سوار
هاتن لەژووردا بزووت و خیرا
برنەو لەبەردەم ، دەمانچە لەقەد
سمێل قیت و قنج ، چاوگشت و وریا
موهەیا لەبۆ شەڕو جنێودان
توورە ، شەڕانی ، بێ ئابروو حەیا

هاتن دابەزین ، بۆسەلاو کردن
یەکێکیان ووتی : ئەی کوانی عەولا
ووتم : ئەوهات فەرموونە ئێرە
من لەو قسانەو عەولا لەژێرا
خێرا هاتەوە ، بەڕوویەکی خۆش
ووتی : بەخێربێن . . بەخێربێی کوێخا

— ٤ — چەندو چوون

لێفەیەکی شڕی کۆن کۆنی درراو
هیناوو ڕایخست دوور لەخورە تاو
ووتی دەفەرموون . . . دانیشن . . انجا
یاخوا بەخێربێن وەسەر بانی چاو
کوێخاکە ووتی : سەلامەت نەبی
وەکوێرایی چاو . . . وەملی شکیاو
کوا تووتن . . کوانی ڕستەیی ووشکت
کوانی چارداغت . . هەی کەران باوگاو

تووتنەوان ووتی : بۆچی جوین ئەدەی
نەهاتم بۆدار ، نەهاتم بۆداو
ئیستاش چ حەقی جوین‌دانت هەیە
قسووری خۆتە ، من‌چبکەم پیاو !
ئەی کویخا ووتی : چون پیم‌ئەوەری
چۆن خوی گیف‌ئەکات لیم‌دیتەجواو
کەی هاتووی هەتیو بلێی فلان کەس
من‌داوم ئەویت ، هەی ئابروو تکاو
تووتنەوان ووتی : ڕۆژی شایەکە
نەهاتمە لاتو ناردمتە ئاسیاو ؟
نەم‌ووت مام‌کویخا داوم پێویستە
نەت‌ووت نەماوە ناردومە بۆداو ؟
— ٥ — ماڵ ویرانی
لەو ڕۆژەوە تا هەتا کو ئیستا
نەداوم دیتو نەڕەحمەتی خوا

من‌داوم نه‌بێ ، کرێ داونه‌کرم
چارداغ له‌کوێ بوو له‌کوێ ی بینم سا ،
انصافت هه‌بێ ، سه‌یری حالم که
ڕه‌وشتت چۆنه ، چۆن‌منت هێنا
هه‌تا اقناعت کردم به‌ئاودێر
خۆت کرده نۆکر من‌بوم به‌ئاغا
که‌هاتم زکم که‌وته سه‌ر زه‌وی
تووتنم چاندو ڕه‌نجی شانمدا
ئه‌لیم داربکره ، ئه‌لیم داوبێنه
ئه‌لیم برسیمه ، ئه‌لێی پاره‌کوا ؟
من‌به‌بێ پاره‌و منداڵم برسی
له‌کوێ قوڕبینم بیکه‌م به‌سه‌ر ما
کوێخا که‌ووتی ، عه‌ولا ، گوێ کره
پیاو ئه‌مه‌تا شت‌له‌یاد نه‌کا

ئیمە قەولمان نۆهەت دینـاربـوو
سـەدو بیستتخوارد هەتاکو ئیستـا
ئیستاش بەرۆکم ئـەگری بـۆپارە
پارەیچی ، کورە خوارداشتنەما !

## ــ ٦ ــ حسـاو

توتـەوان وو‌تـی : بوم‌بکەن حساو
بزانـم وازوو چـون پارەم تەواو
وابـووە دوو مانـگ هیچتان نەداومی
کویخـاکە وو‌تـی : وەسەر بانی‌چـاو
ئا ، مەلاسەعید . . دەفتەرت دەرکە
سەیری‌کە عەولا چی هاتوتـە نـاو ؟
کابرای لەگەڵ ئـەم تومەز مەلابوو
مەلایـیکي گـەنج تازە ڕیش تـاشراو
هـەرزەو دلداری لەڕوو ئـەبـاری
سمیـل بـاریـکی چـاوکل تیکراو . .

مەلا دەفتەری لەباغەل دەرکرد ،

دەفتەر چەدەفتەر پەڕپووتو کەچلاو

ئەرقامی زلزل خەتی خواروخێچ

املا فارسی بەکوردی نووسراو

نەمدی پەڕێکی بێ‌فیل نوسرابێ

نەمدی ووشەێك ساغو نەڕنراو

مەلا دەفتەری سەرو ژێر دەکرد

عەولا منتظر ملکەچو داماو

کویخا سمێلی مشتو مالْ‌دەکرد

منیش بیرلەسەر عەولای مالْ‌رماو

— ٧ — حساو کردن

سەری هەلبری پاش دەمیك مەلا

ئێمەش لەگەلْ‌ئەو گوی قولاخ‌ابجا

ووتی : مام‌عەولا ئەمە حسابت

پەنجاو شەش دینار لەدەستی کویخا

سیی دینار گاجووت چواریش کەرەستە
بیستو پینج دینار کەرەستەو ئەشیا
دوو دینار جارێك سێ دیناری کەش
لەمنت وەرگرت لەماڵی ئاغا ،
جمعی سەدوبیست دینارە تەمام
بەگویرەی دەفتەر صحیحە واللە
توتنەوان وتی : گویخا آورەحمان
پەنجاو شەش دینار لەکوێندەر درا
کویخاکە وتی : گویا درۆیە
گویامن بەتۆ ئەکەم افترا !
ئاخر ئەمەتا چاکەی نالەبار
لەعنەت لەباوکی خوارو خیچ بدا
ئیستاش چ حەقت لای من نەماوە
خوارداشت وەرگرت گەلیکیش زیاد

گەر پارەت دەوێ تووتن سەلەمکە

لەسەر بەشی خۆت هەر چەندی بکا !

## نامەیەك بۆ دلزار (١)

دلزار شعرەکەت ، دلزار شعرەکەت

دلزار نامەکەی پـڕر شعـورە کەت

گەیشتە دەستم لەوەختێکی وا

کافربە حالم نەیـتن خوا ،

ئەڵێی شەش سەدو کسوور قەرزاری

ئایا بۆ پارە زور گیانە هاری ؟

زرنگو هۆری درهەمو پارە

بۆمن خەیاڵی خەونی بەهارە !

درهەم بزانی لەجێیێ منهەم

بەگوڕ ڕائەکا لەم چەم بۆئەوچەم

مــــن پیادەمو یـاره ســواره
ڕاوکەری ئـەوم لەئەم دیاره !

جارجار لەدۆڵێـك ئەحەسێتەوه
كه ئەچمه سەری ئەسڵە مێتەوه

گــومبەتە ئەداو بەتاو ڕائەكا
من بێ ملجأو بێ پەڕوا ئەكا

بەڵام ڕۆژێك دی دەردەستێ بكەم
بەپەتوه كو سەگ دەست رستی بكەم

چەكمه حەساری ئەكەم وەكو شێت
راكێشی ئەكەم ئەیخەمه ژێر پێت

---

( ١ )ئەمهەلبەستە وەلامی نامەیەكی دلزارەكە خاوەنی
كتیبخانەی كویسنجق ئەبێ داوای هەندی قەرزی لێ ئەكا